


دەزگای چاپ و بلاوکرنەوەی O.P.L.C
پرۆژەی ماف بۆ بەرهەمە یاساییەکان
ژمارە (٢٦)

# فەلسەفەو یاسا

# لەچەند وتارێکدا

د. کەمال سەعدی مستەفا
مامۆستای مافی مرۆڤو یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی
زانکۆی سەلاحەددین / هەولێر

هەولێر - ٢٠٠٥

دەزگای چاپ و بڵاوکرنەوەی O.P.L.C
پرۆژەی ماف بۆ بەرهەمە یاساییەکان
ژمارە (٢٦)

ناوی کتێب : فەلسەفەو یاسا لەچەند وتارێکدا
دانانی : دکتۆر کەمال سەعدی مستەفا
چاپی یەکەم : ٢٠٠٥
پیتچنین‌و کاری کۆمپوتەری : دانەر خۆی
دەرهێنانی هونەری : هیوا ابراهیم حەیدری
تیراژ : ٥٠٠ دانە
چاپخانە : کەوێڵ

کۆمەڵگای شارستانی ئەو کۆمەڵگایەیە کە ڕێز لە ئازادیەکان دەگرێ هەروەها دەزگای دیموکراسی تیایدا دادەمەزرێو لەلایەن ئەو دەزگایانەوە کاروباری ولات بەڕێوە دەچێ نەك لەلایەن کەسانەوە .

بەواتایەکی‌تر کۆمەڵگای شارستانی پابەندی ڕێزگرتنە لە یاسا، پلەی شارستانێتی هەر کۆمەڵگایەکیش بەپێی بڕی ڕێزگرتنیان لە یاسا دەپیورێ هەروەکو ئەرستۆ وتەنی .

جالێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدا ئەویش ئەوەیە بۆچی یاسا؟ هەروەها بۆچی دیموکراسی‌یەت ؟

ئێمەش لەوەلامدا دەڵێین لە کۆمەڵگای دیموکراسیدا گەل خاوەنی گشت دەسەلاتەکانە دەسەلاتی یاسادانان، جێبەجێکردن ، دادگەری وە لەبەرئەوەی ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانان ڕاستەوخۆ لەلایەن گەلەوە لە ڕێگای دەنگدانەوە هەڵدەبژێردرێن کەواتە ئەوانە نوێنەری گەلن . وەلەبەر ئەوەی ئەو ئەنجومەنە تایبەتە بە دانانی یاسا لە ولاتدا ، کەواتە ئەو یاسایەی ئەوان دەری‌دەکەن گوزارشت لە بیروڕای گەل دەکات هەروەکو جان جاك ڕۆسۆ دەڵێ . واتە ویست و ئارەزووی گشتی.

کەواتە ڕیزگرتن لە یاسا ڕیزگرتنە لە ویست و ئارەزووی گشتی‌ی کۆمەڵ. وە لەبەرئەوەی پرۆسەی دیموکراسی‌یەت ئالیەتی کارکردنە بۆ بەدیهێنانی ئازادیەکان لەوانە ئازادی دەنگدان و ئازادی خۆپالاوتن بۆ ئەنجومەنی یاسادانان و ئەنجومەنەکانی تر وەك ئەنجومەنی گەل و ئەنجومەنی ڕاژەو ئەنجومەنی شارەوانی .

کەواتە لەڕێگای دیموکراسیەتەوە مرۆڤ دەتوانێ پرۆسەی مافەکانی بکات لە سەرووی هەموویانەوە ئازادی‌یە کە بە پیرۆزترین ماف دەژمێردرێ و سەروەری سەرجەم مافە سرووشتیەکانە .

ئێستا پاش ئەوەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگای شارستانیو دیموکراسی‌یەت هەروەها پەیوەندی نێوان دیموکراسیەت و ئازادی‌یەکان بەدەرخست دەتوانین بڵێین دیموکراسی‌یەتیش لەگەڵ هەڵبژاردن دەخوولێتەوە ، بەچەشنێك هەرکاتێك پرۆسەی هەڵبژاردن هەبوو دیموکراسی‌یەتیش دەبێت وە بەنەبوونی هەڵبژاردن ئەویش نابێت وە بەلاوازی ئەو ئەویش لاوازەو بە بەهێزی ئەو ئەویش بەهێزە .

کەواتە چەندی پرۆسەی هەڵبژاردن بەهێز بێو پانتاییەکەی زیاتر بێو زۆرترینی بوارەکان بگرێتەوە هێندە دیموکراسی‌یەت پێش دەکەوێت و گەشەدەکات .

بۆیە دەتوانین بڵێین لەکۆمەڵگای شارستانیدا گەل لە ڕێگای دەزگا دەزگا شارستانی‌یە سەربەخۆکانەوە حوکمڕانێتی خۆی دەکات ، ئەو دەزگایانەش بریتین لە دەزگا ڕامیاری‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیری‌یەکان .

دەزگا ڕامیاری‌یەکان بریتین لە پارت و ئەنجوومەنی گەل و ئەنجوومەنی شارەوانی ، دەزگا ئابووری‌یەکانیش بریتین لە کۆمپانیا بازرگانی‌یەکان و بانکەکان و بازارگە هەرەوەزی‌یەکان ، دەزگا کۆمەڵایەتی‌یەکانیش بریتین لە سەندیکاو کۆمەڵەو یەکێتی‌یەکان ، دەزگا ڕۆشنبیری‌یەکانیش قووتابخانەو زانکۆو مەڵبەندی ڕۆشنبیری و گەلەری‌یەکان دەگرێتەوە.

شایەنی باسە ، ئەو دەزگایانە ئەودەزگایانە تەواوی سەربەخۆیی خۆیان هەیەو دوورن لە دەست تێوەردانی دەوڵەت و ڕاستەوخۆ لە لایەن چین و توێژەکانی گەلەوە و لەڕێگای هەڵبژاردنەوە دەستەی بەڕێوەبردنیا هەڵدەبژێردرێ.

جابۆئەوەی ئەم چین و توێژە نوێنەری خۆیان لەودەزگایانەدا هەڵبژێرن دەبێ پرۆسەی مافی ئازادی‌ی‌هەڵبژاردن بکەن وە بۆئەوەی پرۆسەی ئەم مافە بکەن دەبێ پرۆسەی دیموکراسی‌یەت بکەن کەواتە دیموکراسی‌یەت سەرەتایەکە بۆ ئازادی‌ی‌وەکو سەرۆکی میسری جەمال عەبدول ناسر وتەنی .

سەبارەت بە پابەندبوونی کۆمەڵگای شارستانی بۆ بوون و نەبوونی ی زانای فەرەنسی بەناوبانگ برۆدۆن دەڵێ : (کۆمەڵگای شارستانی لە بەرزترین پلەیدا ئەوکاتە دەبێ کە فەوزاز نیزام یەك دەگرن ) واتە ئەوکاتە ی کە کۆمەڵگا فەوزای تیا نامێنێ .

هەروەها فەیلەسوفی ئینگلیزی هۆبز لەم بارەیەوە دەڵێ : (بەلەدەست دان و نەمانی یاسا فەوزا باڵ بەسەر کۆمەڵدا هەڵدەکێشێ ) هەروەها بۆ پێناسەی فەوزاش ئەوزاتە نەمرە دەڵێ : ( لەکۆمەڵگای فەوزادا جەنگی هەمووان دژی هەموانە) واتە هیچ کەسێك تیایدا خاوەن ماف نابێت .

هەربۆیە کاتێك فەیلەسوفی یۆنانی سوقرات خەڵکی یۆنانی لە یاسا ستەمەکانی پاشای ئەسینا وشیار دەکردەوە و هانیدەدان بۆ شۆرش کردن بۆ چاکردنی ئەو یاسایانە ، کاتێك پاشای ئەسینا فەرمانی گرتنی سوقراتی دەرکرد و بڕیاریدا ژەهرخوارد بکرێ بە تۆمەتی ژەهراویکردنی مێشکی لاوان . هەندێك لە قووتابییەکانی چوونە لای ویستیان لە بەندیخانە بیدزنەوەو ئازادی بکەن ، بەلآم ئەو خواردنەوەی ژەهری بەلاوە باشتر بوو لە سەرپێچیکردنی یاسای وڵاتەکەی بۆیە داوای قووتابییەکانی ڕەتکردەوە .

هەرسەبارەت بە ڕێزگرتن لە یاسا ئەرستۆی فەیلەسوف وەك سوقراتی ماموستای ئاسا دەڵێ : ( بوونی یاسایەکی ستەم باشترە لە نەبوونی یاسا ، چونکە ئەگەر لەبەر سێبەری یاسایەکی ستەمدا بەشێك لە مافەکانمان لەدەست بدەین ، ئەوا بە نەبوونی یاسا گشت مافەکانمان لەدەست دەدەین ) .

ئەوەی بیر بکاتەوە دوو دڵیش دەبێ ، بە پێچەوانەشەوە ئەوەی بیر نەکاتەوە ناشزانێ دوو دڵی چیە .

لە دێرزەماندا ، گەلانی کۆن زۆر بیریان نەدەکردەوە بۆیە دوودڵیش نەدەبوون ئەوان بە ساکاری سەیری ژیانیان دەکرد بۆیە بە ساکاریش ژیانیان بەسەر دەبرد هەر بۆیەش پێش نەدەکەوتن چونکە زۆر بیریان نەدەکردەوە .

کەواتە بیرکردنەوە هۆکارێکە بۆ پێشکەوتن ، پێشکەوتنیش نابێت ئەگەر دوودڵی لەگەڵدا نەبێت .

لەم ڕووەوە د. عەلی وەردی دەڵێ : ( مرۆڤی بەر لەشارستانیەت بیریان نەدەکردەوە بۆیە دوو دڵیش نەدەبوون)

هەروەها سەبارەت بە پەیوەندی بیرکردنەوە بە بوون و مانەوەی مرۆڤ دیکارت دەڵێ : ( من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم ) هەروەها ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ قورئانی پیرۆز وەیان تەورات ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەتوانای بیرکردنەوە لەو کاتەوە بەخشراوە بە مرۆڤ کە باپیرە گەورەمان ئادەم سڵاوی خوای لێبێت بەری داری مەعریفەی جیاکردنەوەی خێرو شەڕی بەقسەی شەیتان لەبەهەشت خوارد .

بەخواردنی بەری دارە قەدەغەکراوەکەی بەهەشت مرۆڤ مەعریفەی جیاکردنەوەی خێرو شەڕی لەیەکتر چەشت بۆیە سەرئێشەی خێرو شەڕیشی لەسەر زەوی بۆ مایەوە .

شایەنی باسە ، کۆمەڵگای شارستانیو کۆمەڵگای ناشارستانی بەوە لەیەکتر جیا دەبنەوە کە کۆمەڵگای یەکەمیان لەڕەچەڵەکی هەموو شتێك دەکۆڵێتەوەو خۆی لەخۆی پرسیار دەکات و دەڵێ لەبەر چی ؟ تاکو بگاتە هەقیقەتی شتەکان ، بەڵام کۆمەڵگای دووەم ناپرسێ بۆچی؟ بۆیە هەر بە دواکەوتوویی دەمێنێتەوە .

# هەڵبژاردن و دیموکراسییەت

ئەگەربێت و سەرنجی چەمکی هەڵبژاردن و دیموکراسی یەت بدەین دەبینین پەیوەندی یەکی زۆر بەتین لە نێوانیاندا هەیە، زەحمەتە بتوانین تخوبێک بۆ هەریەکێك لەوانە دابنێین . بەڵکو تێکهەڵکێشن و لە تەفاعولکردنێکی بەردەوام دانە لەگەڵ یەکتریدا .

سەرەتا ئەگەر لە چەمکی هەڵبژاردن و پەیوەندی یەکەی لەگەڵ یاسادا وردبینەوە دەبینین پەیوەندی یەکی کاریگەرو ڕاستەوخۆ لە نێوانیاندا هەیە .

کە دەڵێین یاسا مەبەستمان مانا هاوچەرخەکەیەتی ، کەبریتی یە لە یاسای دانراو . هەڵبەتە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ، لەم سەردەمەداو دوابەدوای تیۆری یەکەی مۆنتسکیۆ و هاتنەکایەوەی پرنسیپی لێکجیاکردنەوەی هەرسێ دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادگەری لەناو دەوڵەتدا ، ئێستاکە بەشێوەیەکی گشتی لەلاین دەسەڵاتی یاسادانانەوە یاسا دادەندرێ و ئەم دەستەیە تایبەتمەندە بە دانانی یاسا، ئەندامەکانیشی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەلایەن گەلەوەو لەڕێگای هەڵبژاردنێکی ئازادو بە دەنگدانی نهێنی هەڵدەبژێردرێن.

جاکەواتە هەڵبژاردن و یاسا لکاون بەیەکەوەو لێك جیاناکرێنەوە.

شایەنی ئامارەبۆکردنە ، کەدەڵێین هەڵبژاردن ، مەبەستمان هەڵبژاردنی نوێنەرانی گەلە لەلایەن گەلەوە . جائەو نوێنەرانە دەسەڵاتی باڵان لەناو کۆمەڵداو تایبەتمەندن بە دانانی یاساو لەکاتی پرۆسەکردنی کارەکانیان گوزارشت لە ویست و ئارەزووی گەل دەکەن ، بۆیە ئەو یاسایەی ئەوان دایدەنێن گوزارشت لەویست و ئارەزووی ئەوان دەکات . بەمانایەکی تر ئەویاسایانە گوزارشت لە ویست و ئارەزووی گشتی ی دەکات بۆیە دەبێ ڕێزی

لێ بگیرێت لەلایەن هەردووچینەوە ، چینی دەسەلاتمەندو ژێردەسەلات ( الحاكم والمحكومين ) تەنانەت لەلایەن خودی یاسادانەر چونكە لەدانانیدا گوزارشتی لە ویست و ئارەزووی گەل كردووەو بۆی نیە سەرپێچی لێبكات .

كەواتە یاسا لەم سەردەمەدا شەرعیەت لە هەڵبژاردن وەردەگرێت ، واتە ئەویاسایەی گەل خۆی بۆخۆی دایناوە لە ڕێگەی نوێنەرەكانی یەوە دەبێ ڕێزیشی لێ بگرێت و سەرپێچی لێنەكات چونكە ڕەوایە .

سەبارەت بە پەیوەندی نێوان هەردوو چەمكی هەڵبژاردن و دیموكراسی یەت لەگەڵ یەكتریدا ، هەروەكو پەیوەندی نێوان هەڵبژاردن و یاسا پەیوەندی یەكی بەتینە.

ئاشكرایە ، ووشەی دیموكراسی یەت یانی دەسەلاتی گەل . بەواتایەكی‌تر یانی حوكمڕانێتی‌گەل خۆی بۆخۆی .

بۆیە دیموكراسی یەت لەگەڵ هەڵبژاردن دەخولێتەوە ، بەبوونی دەبێت و بەنەبوونی نابێت و بە بەهیچزبوونی بەهێز دەبێت بەلاوازبوونی لاواز دەبێت .

بەم شێوەیە دەبینین پەیوەندی‌یەكی زۆربەتین لەنێوان دیموكراسی یەت و هەڵبژاردن هەیە ، چونكە لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە گەل نوێنەری‌خۆی هەڵدەبژێرێ بۆ ئەنجومەنی یاسادانان كەبالاترین ئەنجومەنە لەناو دەوڵەتداو موتمانە دەدا بەحكومەت .

كەواتە ئەگەر هەڵبژاردن هەبێ ئەوا دیموكراسی‌یەتیش دەبێ ، واتە گەل خۆی حوكمڕانێتی‌خۆی‌دەكات .

سەبارەت بە هەردوو چەمكی دیموكراسی یەت و ئازادی‌ی سەرەتاو بنەتای یەكترن و بی‌ی یەك هەڵناكەن چونكە دیموكراسی یەت پێشەكی‌یە بۆ ئازادی‌و باشترین بوارە بۆ پرۆسەكردنی . واتە تاكو دیموكراسی یەت نەبێ ئازادیش نابێت .

لە سیستمی دیموكراسیدا ، مرۆڤ پرۆسەی ماف و ئازادی‌یەكانی دەكات چونكە لەوێدا خۆی حوكمڕانێتی خۆی دەكات هەروەكو لە پێشەوە ڕوونمان كردەوە.

ئەو وڵاتانەی باوەڕیان بە دیموکراسی‌یەت هەیە ، بڕواشیان بە ماف و ئازادی‌یەکان هەیە . بەمانایەکی‌تر باوەڕیان بەمافە سروشتی‌یەکان هەیە . بۆیەکا لەوێدا مرۆڤ پرۆسەی گشت مافەکانی دەکات لەوانە ئازادی‌یەکان بەو سیفەتەی کە لکاون بە کەسایەتی‌یەکەیەوە و لێی جیا نابێتەوەو لەگەڵ سروشتی مرۆڤایەتی‌یەکەی دەگونجێ ، بەڵام لە سیستمی دیکتاتۆری‌و نادیموکراسی‌یەکاندا مەحاڵە ئەمە بەدی بکەین .

بەڵام سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئازادی‌و کۆمەڵگەی شارستانی ، هەڵبەتە پەیوەندی‌یەکی زۆر بەتین لە نێوانیاندا هەیە چونکە لە کۆمەڵگەی شارستانیدا گەل لەڕێگەی دامەزراوە سەربەخۆکانەوە حوکمڕانێتی خۆی دەکات و خۆی بەڕێوەدەبات.

ئەندامەکانی ئەم دەزگاو دامەزراوانەش لە ڕێگای هەڵبژاردنێکی ئاشکراو دەنگدانی نهێنی لەلایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێن . واتە هەرتاکێك لە تاکەکانی گەل پرۆسەی ئازادی دەنگدان و ئازادی‌ی خۆپاڵاوتن دەکەن بۆ دامەزراندنی ئەو دەزگاو دامەزراوانە .

شایەنی‌باسە ، دەزگاو دامەزراوەکان لە کۆمەڵگەی شارستانیدا ڕوو لەزۆرین لەوانە ئەنجومەنی یاسادانان و ، ئەنجومەنی گەل و ، ئەنجومەنی شارەوانی‌یەکان و ، ئەنجومەنی ڕاژەو سەندیکاو یەکێتی‌و کۆمەڵەو ڕێکخراوە جۆراوجۆرەکان دەگرێتەوە . ئەودەزگایانە لە ڕاپەڕاندنی کارەکانیاندا سەربەخۆن و دوورن لە دەستێوەردانی حکومەت و ئازادانە کارەکانی خۆیان بەڕێوە دەبەن . کەواتە ئازادی‌ی سیمایەکی هەرەدیاری کۆمەڵگەی شارستانی‌یە .

هەرچەندە ، هەروەکو لەوەو پێش وتمان زەحمەتە تخوبێك بۆ هەرچەمکێك لەم چەمکانە دابنێین چونکە هەموویان پەیوەندیان بەیەکەوە بەهێزەو لێك جیاناکرێنەوە .

بۆنموونە ، پەیوەندی‌یەکی زۆر بەهێز لە نێوان کۆمەڵگەی شارستانی‌و یاسا لە لایەك و کۆمەڵگەی شارستانی‌و هەڵبژاردن یان دیموکراسی‌یەت وەیان

ئازادیی لەلایەکی ترەوە هەیە ، بۆیە دەبینین هەرفەیلەسوفێك لە گۆشەیەکی تایبەتەوە سەیری دەکات و بەشێوەیەکی جیاواز لەوانی تر وەسفی دەکات . هەندێکیان دەڵێن کۆمەڵگەی شارستانی لەگەڵ دیموکراسی یەتدا دەخولێتەوە بە بوون و بە نەبوون بە بەهێزیو بەلاوازی . هەندێکی تریان وەك ئەرستۆ دەڵێن پلەی شارستانێتی هەرکۆمەڵگەیەك دەپێورێ بە پێی رادەی رێزگرتنیان لە یاسادا . هی تریش هەن لە گۆشەی مافە سروشتی یەکانەوە سەیری دەکەن و دەڵێن کۆمەڵگەی شارستانی ئەو کۆمەڵگەیەیە کەتیایدا مرۆڤ پرۆسەی گشت مافەکانی خۆی دەکات لەوانەش ئازادی یە گشتی یەکان .

لەکۆتاییدا ، ئەگەربێت و ئەم بیرۆکەیە لەسەر کوردستان تەتبیق بکەین دەبینین بیرۆکەی ئازادیی و دیموکراسی یەت و کۆمەڵگەی شارستانی بۆتە بەشێك لە پێکهاتەی هزریی مرۆڤی کورد . بۆیە هەنگاوی خێرا لەم مەیدانەدا هاوێژراوەو ئەم بیرۆکەیە بۆتە ئایدیۆلۆژیو فەلسەفەی حوکم لێرەداو دەیان سەندیکاو کۆمەڵەو رێکخراوو دەزگاو دامەزراوە سەربەخۆکان روو لە زۆریدانەو هەڵبژاردنی سەرۆك و ئەندامانی ئەنجومەنی شارەوانی یەکانیش بەشێکن لەم فەلسەفەیەو چاوەڕێی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی گەل و ئەنجومەنی راژەش دەکرێ ، کە هەردووکیان تەواوکەری دەزگاو دامەزراوە سەربەخۆکانی کۆمەڵگەی شارستانین .

هەروەها جێی ئاماژەبۆکردنە ، کە نابێ ماوەی ئەندامێتی هەر ئەنجومەنێك لەم ئەنجومەنانە بە ئەنجومەنی یاسادانانیشەوە زۆر درێژ بێت ، چونکە لەو حاڵەتەدا هەندێك جیل کە لێهاتوو (راشد و بالغ ) دەبن لەوماوەیەدا وەیان لەپێشتریش لێهاتووبوونە بەلام ویست و ئارەزوویان بەرامبەر مانەوەو نەمانەوەی نوێنەرەکانیان گۆڕاوە لە پرۆسەکردنی ئازادی یەکانیاندا بێبەش دەبن ئەمەش لەگەڵ دیموکراسیو ئازادیو کۆمەڵگەی شارستانی ناگونجێت .

# بیرکردنەوەو دوودڵی

شــاراوە نیە کـەهیچ ڕاستیەکی ڕەها لـەدونیادا نیە بەڵکو هـەموو شتێك ڕێژەیـی یـەو لـە ڕوانگـەی یەکێکـەوە بۆ یـەکێکی تـر دەگۆڕێت و مـرۆڤ خـۆی پێوەری ئەمەیە هـەروەکو سـۆفستائی یۆنانی برۆتۆجۆراس ووتەنی : ( مرۆڤ پێوەری گشت شتێکە) هەروەها لـەبارەی هـەقیقەتەکان ولیم جیمس دەڵـێ : (هـەقیقەت لـە گریمانەیەك زیاتر نیـە ، مرۆڤ گریمانـەی دەکـات بـۆ ئـەوەی پەنای بباتە بەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ژیانی).

کەواتە بۆئەوەی پێش کەوین دەبێ بیربکەینـەوەو لـە هەمووشتێك دوودڵ بین واتە گومان لەهەموو شتێك پەیدا بکەین تاکو بگەینە ئەو هەقیقەتەی بەلای ئێمەوە ڕاستە کەئەوەش لەئەنجامی ناکۆکی گشت هەقیقەتـەکان دەبێ کە لە ئەنجامدا هەقیقەتێکی مام ناوەندی دێتە ئاراوە کەبۆ هەموان باشــە .

لەم ڕووەوە پرنسیپێك هەیە دەڵێ : ( گومـان سـەرەتای بێگومـانیـیە الشك مبدأ اليقين - ) .

بۆیە ئەوەی بەلای تۆوە هـەقیقەتە بەلای یەکێکیتر هـەقیقەت نیە چونکە هــەقیقەت و ناهەقیقـەت الحـق و البـاطل- لەڕاسـتیدا دووشـتی بەیەکـەوە لکاون . هەرکاتێك هەقیقەت هەبێ ناهەقیقەتیش لەگەڵیا دەبێت .

ئەگەر دوو گرووپ لەسەر شتێك لەگەڵ یەکتر ناکۆك بوون ئـەو ناکۆکیـیە ئـەوە دەگەیـەنێ کـە هـەردوولایان هـەق و ناهــەقن لەیـەك کـاتدا هــەروەکو ئینیشتاین ووتەنی : ( ليس هناك بديهيات ثابتة بل في الواقع عادات فكرية ) .

لەکۆتاییدا دەڵێم هیچ شتێك پیرۆز نیە بەو واتایـەی کـە بقـەبێ بـیری لێبکەینەوەو گومانی بخەینەسەر بەمەبەستی گەیشتن بەڕاستی تەنانەت کوفر کردنیش بەشێکــە لە بــاوەڕ .

# ئیسلام و مافی مرۆڤ

ئایینی ئیسلام دانی بە بیرۆکەی ماف ناوە بە مافی مرۆڤیشەوە، بەڵام بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندیی گشتیی کۆمەڵ، گەلێك کۆت و بەندی لەبەردەم داناوە، بۆئەوەی مرۆڤ نەتوانێ ئەم مافانە بەشێوەیەکی خراپ بەکاربهێنێ و زیان بە خەڵکانیتر بگەیەنێ. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هێنانەدی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ چ وەکو تاکەکەس یان وەك کۆمەڵ، مەبەستی سەرەکی ئایینی ئیسلامە. بۆیە لە ئایینی ئیسلامدا دان پیانان بە ماف شتێکی زۆر ئاساییە، ئەو کۆت و بەندانەش کە لە بەردەم خاوەنەکەی دانراوە، بۆئەوەی هاوسەنگی لە نێوان بەرژەوەندی تاکەکەس و بەرژەوەندی کۆمەڵ پارێزراو بێت.

وەلێرەدا دەبینین، کە چۆن ماف لە ئایینی ئیسلامدا بە بەرگێکیتر خۆی دەنوێنێ و شێوەیەکی مام ناوەندی وەرگرتووە لە نێوان هەردوو ڕێچکەی تاکپەروەرو ڕێچکەی کۆمەل پەروەریدا.

لە ڕاستیدا هۆی دانپیانانی ئایینی ئیسلام بۆ مافەکانی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕێزەی کە خوای گەورە لە مرۆڤی ناوە، هەروەکو خوای گەورە لە سورەتی (الاسراء) ئایەتی/٧٠ دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنْ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا﴾ هەر بەم مەبەستە خوای گەورە لە چەندین شوێندا جەختی لەسەر یەکسانی مرۆڤ کردووەو تەنانەت مافی یەکسانیی مرۆڤ لەبەردەم یاسا و لە گشت بوارە جیاجیاکانی کۆمەڵایەتی، بە مافێکی هەرە گرنگ داناوە، بۆیە ئاماژەی بەوە کردووە کە مرۆڤ هەرهەمووی لە یەك نەفس دروست بووە کە ئەویش باپیرە گەورەمان حەزرەتی ئادەمە لە سورەتی (النساء) ئایەتی/١

دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مرۆڤ هەر هەموویان بۆ یەك جۆرو یەك بنەچە دەگەڕێنەوە بۆیە هەرهەموویان یەکسانن لە ماف و ئازادییەکاندا، هەروەها لە سورەتی (الانسان) ئایەتی/٢ دەفەرموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ هەروەها پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ: ((کلکم راع وکلکم مسؤول عن رعيته)). هەر لە میانی ئەو ڕێزلێنانەی خوای گەورە کە لە مرۆڤی ناوە، ئینجا ئەو شتانەی کە لە زەویدان هەر هەمووی تەرخانکردووە بۆ مرۆڤ بۆئەوەی لە ژیانی ڕۆژانەیدا وەك مافێکی ئابووری و کۆمەلایەتی سوودی لێ وەربگرێ، هەروەکو لە سورەتی (البقرة) ئایەتی/٢٩ ئەمەمان بۆ دەردەکەوێ کە تیایدا هاتووە: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾.

جا سەبارەت بە خولقاندنی مرۆڤایەتی لە شێوەی گەلان و تیرەو عەشیرەت، خوای گەورە مەبەستی ئەوە نەبووە کە لە یەکتریمان جیا بکاتەوە، بەڵکو مەبەستی ئەوەبووە کە یەکتری بناسین و بە یەکسانی بەیەکەوە بژین، هەروەکو لە سورەتی (الحجرات) ئایەتی/١٣ ئەمەمان بۆ دەردەکەوێ کە تیایدا خوای گەورە دەفەرمێ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾.

مافی ژیان لە مافە هەرە گرنگەکانە لە ئایینی ئیسلادا، ئەمەشمان لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز بۆ بەدەردەکەوێ، لەوانە، خوای گەورە لە سورەتی (المائدە) ئایەتی/٣٢ دەفەرموێ: ﴿مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا﴾. لەمەش زیاتر بەڵکو سزایەکی توندیشی بۆ ئەو کەسە داناوە کە یەکێك بە ناهەق

دەکوژێ، لەم بارەیەوە خوای گەورە لە سورەتی (النساء) ئایەتی (٩٣) دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾.

هەروەها خوای گەورە بایەخێکی زۆری داوە بە مافی بەشداریکردن لە حوکمڕانێتی وڵات، بۆ ئەم مەبەستە پرنسیپێکی گرنگی داناوە کە ئەویش ((پرنسیپی شورایە)) هەروەکو لە سورەتی (الشوری ) ئایەتی/٣٨ دەفەرموێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾. هەروەها بایەخی بە مافی ئازادیی بیروباوەڕ داوەو لە سورەتی (البقرە) ئایەتی/٢٥٦ دەفەرموێ: ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾. وە لە بارەی مافی ڕیزگرتن لە حورمەتی مەسکەن، خوای گەورە لە سورەتی (النور) ئایەتی/٢٧ و٢٨ دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ ، ﴿فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِنْ قِيلَ لَكُمْ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾.

هەروەها دانی بە مافی خوێندنو فێرکردنو مافی دەسبەکاربوون لە فەرمانە گشتییەکانو مافی شوفعەو چەندین مافیتر ناوە. جا لەبەرئەوەی خوای گەورە خۆی خاوەنی هەموو شتێکە، بۆیە خۆی دامەزرێنەرو بەخشکەری مافو ئازادییەکانە، بەڵام خوا مرۆڤی لەسەر زەوی کردۆتە خەلیفەی خۆی بۆ بەکارهێنانی ئەو مافانەو بۆ ئەم مەبەستە ڕێگای پێداوە سوودیان لێ وەربگرێت. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ماف لە ئایینی ئیسلامدا بەخشش (منحە) ێکە کۆمەڵێك مەرجی لەگەڵدایە بۆ هێنانەدی ئەو بەرژەوەندیەی کە لە پێناویدا مافەکە دروست بووە، وە سەرچاوەی ئەو بەخششەش دانپیانانی خوای گەورەیە، نەك سروشت، هەروەکو لایەنگرانی ڕێچکەی تاکپەروەر وای دادەنێن، بۆیە ئایینی ئیسلام باوەڕی بە مافی ڕەها نیە.

جا ئەگەر بیرۆکەی ماف لە ئیسلام بەراورد بکەین لەگەڵ هەردوو ڕێچکەی تاکپەروەرو کۆمەلپەروەر (سۆشیالیستی) دا، بۆمان دەردەکەوێ کە یاسازانیی ئیسلام (الفقه الاسلامی) مافی بە دەسەڵاتێکی ڕێگاپێدراو بۆ هەر کەسێك داناوە کە بە هۆیەوە ئەو کەسە دەتوانێ بەرژەوەندییەکی دانپیانراو بۆخۆی وەدەست بهێنێ، بە پێچەوانەی ڕێچکەی تاکپەروەر کە وای دەبینێ مرۆڤ لە یەکەم چرکەی لە دایك بوونیدا کۆمەڵێك مافی هەیەو ئەم مافانەی لە سروشتەوە وەدەست دەکەوێ بەو سیفەتەی کە مرۆڤە.

لە ڕاستیدا، هیچ ناکۆکیەك لە نێوان یاسازانیی ئیسلامی و ڕێچکەی تاکپەروەریدا سەبارەت بە پیرۆزیی ماف نیە. هەروەها سەبارەت بە مافی خاوەنەکەی بۆ سوود وەرگرتن لەو مافە بە گشت ڕێگا جیاجیا ڕەواکان بۆ هێنانەدی بەرژەوەندی خۆی و بەرژەوەندی کۆمەڵ.

بەڵام قەبارەی ئەو دەسەڵاتەی کە خاوەن موڵك لە یاسازانیی ئیسلامدا هەیەتی وەکو ڕێچکەی تاکپەروەر ڕەها نیە، بەڵکو پابەندی کۆمەڵێك کۆتە، هەروەکو ئەو کۆتەی لەوتاندنی ماف (التعسف فی استعمال الحق) و زیانگەیاندن بە لایەنەکانی‌تر قەدەغە دەکات.

لە کۆتاییدا، لەبەر ڕۆشنایی ئەم بەراوردکردنە ساکارەدا دەتوانین بڵێین کە یاسازانیی ئیسلامی ڕێچکەیەکی مام ناوەندی گرتۆتەبەر لە نێوان ڕێچکەی تاکپەروەری و سۆشیالیستیدا.

# بۆئەوەی ڕۆژنامەنووس هێڵە سوورەکان نەبەزێنێ

هیچ گومانی تێدانیە کە ئازادی سەرچاوەیە بۆ ئەنجامدانی گشت چالاکییەکی مرۆڤایەتی تەنها ئەوانە نەبێت کە بە حوکمی یاساو ڕێساکان ڕێزپەڕ کراون. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەرچەندە ئازادی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا بنەچەیەکی بەرفراوان و ڕەسەنە ، بەلاَم سەرەڕای ئەمەش بە یاساو ڕێساو حوکمە شەرعییەکان سنووردار کراوەو هەرکاتێك ڕووبەڕووی ئەو شتانە بۆوە کە یاساغ کراون ئەو ئازادییە نامێنێ ، خۆ بەپێی حوکمی ئەقڵیش ئازادی لەوکاتەدا نامێنێ کە ئازادی کەسانیتر دەست پێدەکات.

کەواتە ڕۆژنامەنووس هەرچەندە ئازادە لە خودی خۆیو ماف و کاروبارە تایبەتییەکانیدا، بەلاَم سەرەڕای ئەمە لە دوو کاروباردا ئازاد نیە :

١ هەر کاروبارێك ببێتە هۆی تەنگ پێهەڵچنینی ئازادی کەسانیتر ، چۆن ڕۆژنامەنووس ئازادەو هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە دەست بەسەر مافیدا بگرێت هەروەهاش ڕۆژنامەنووس مافی ئەوەی نییە دەست بەسەر مافی کەسانی تردا بگرێت و دەسەلاَتیان لەسەر خودی خۆیان قەدەغە بکات، ئازادیی مرۆڤ لە شتا دیارکراوە بەوەی کە نابێ دەستدرێژی بکاتەسەر ماف و ئازادی کەسانیتر .

٢ ئەو کاروبارانەی کە بە یاساو ڕێساکان قەدەغە کراون، ڕۆژنامەنووس مافی ئەوەی نیە سەرپێچییان بکات، چونکە ئەو یاساو ڕێسایانە بۆ پاراستنی کۆمەڵ و بەرژەوەندییەکی گرنگتر داندراون و سەرپێچیکردنیان بە ئازادی داناندرێ بەڵکو دەرچوونە لە ئازادی.

کەواتە ئازادی ڕۆژنامەگەری ڕەها نیەو حکومەت بۆی هەیە لە هەندێ حاڵەتدا بەمەبەستی پاراستنی ئاسایشی کۆمەڵ لە چوارچێوەیەکی تەسکدا

کۆتوبەندی لەسەر دابنێ . لەم حاڵەتەشدا هەرچەندە ڕۆژنامەنووس ڕێگای قسەکردن و نووسین و بڵاوکردنەوەی لێ ناگیرێت بەڵام هەرکاتێك ئەم سنوورەی بەزاند بەرپرسیارێتیەکە دەکەوێتە ئەستۆی خۆیو لە ئاکامی ئەو قسەیەی کە کردوویەتی یان نووسیویەتی یان بڵاوی کردۆتەوە ، ڕووبەڕووی لێپرسینەوەو سزایەکی دوایینە دەبێتەوە.

جا بۆئەوەی سنووری ئازادییەکەی نەبەزێنیو ڕووبەڕووی لێپرسینەوەو سزای یاسایی نەبێتەوە، دەبێ پابەندی ویژدانی خۆیو بنەماکانی ئەخلاقی پیشەکەی خۆی بێتو لە هەموو کەسیش زیاتر بەرامبەر بە کۆمەڵەکەیو نیشتمانەکەی هەست بە لێپرسینەوە بکات. جا بۆئەوەی لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان نەکەوێتە هەڵەوە، باشترین شت ئەوەیە، ڕووداوەکان وەکو خۆی بگێڕێتەوە، بەڵام ئەگەرهاتوو گومانی لێ هەبوو، باشتروایە وازی لێ بێنێتو بڵاوی نەکاتەوە. کەواتە ئەگەرهاتوو یەکێك لەو بابەتانەی کە نیازی هەیە بڵاوی بکاتەوە، ئەگەرهاتوو ئەگەری ئەوەی لێکرا کە دەبێتە مایەی تانەوتەشەرو ناوزڕاندنی کەسانێك، دەبێ خۆی ئامادەبکات بۆ وەڵامدانەوەی هەندێك پرسیار، لەوانە، ئەگەرهاتوو داوایەکی لە دژ بۆ دادگا بەرزکرایەوە، ئایا تا چەند دەتوانێ پشت بەو سەرچاوانە ببەستێ کە زانیارییەکانی لێ وەرگرتووە.

# ئازادی ڕۆژنامەگەری و ڕۆژنامەی ئازاد

ئەم دوو چەمکە دوو چەمکی لێکجیاوازن و هەریەکەیان مانای تایبەتی خۆی هەیە و ئاکامی تایبەتیشی لەسەر درووست دەبێ .

سەبارەت بە چەمکی یەکەم ( ئازادی ڕۆژنامەگەریی ) ، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ یاسای چاپەمەنی هەرێمی کوردستان ژمارە ( ١٠ ) ی ساڵی ١٩٩٣ زۆر بەڕاشکاوی بڕیاری لەسەر ئازادی ڕۆژنامەگەریی لە هەرێمی کوردستاندا داوە، ئەمەش لە دەقی ماددە / ٥ ی یاسای ناوبراو بەدی دەکەین کەئەوپەڕی ئاسانکاری نیشان داوە بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە لە هەرێم دا تەنانەت مافی تانە گرتنیشی لە بڕیاری وەزیری ڕۆشنبیری سەبارەت بە ڕەفزکردنی داوای مۆڵەتکردن لەبەردەم دادگای پیاچوونەوە بەهاوولاتی ڕەوابینیوەو هاوولاتی بۆی هەیە لە ماوەی ( ١٠ ) ڕۆژ دوای ڕەفزکردنی داوایەکەی لەبەردەم دادگای ناوبراو تانە لە بڕیاری وەزیر بدات .

کەواتە دەتوانین بڵێین لە هەرێمی کوردستان ئازادی ڕۆژنامەگەری هەیەو بەڵگەش ئەم هەموو چاپکراوە خولەکییانەیە بە گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاوکراوەوە کە لە سەرتاپای کوردستان ڕۆژانەو هەفتانەو مانگانەو وەرزانەو ساڵانە دەردەچن .

بەڵام سەبارەت بە چەمکی دووەم ( ڕۆژنامە نووس و ڕۆژنامەی ئازاد ) دەتوانین بڵێین کاری ڕۆژنامەنووس و ڕۆژنامەکان پشت بە دوو پرنسیپ دەبەستن .

یەکەم : دەبێ ئازادی تەواو بەڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان بدرێ تاکو بتوانن گوزارشت لە بیرو ڕاو بۆچوونەکانی خۆیان بکەن .

دووەم : ڕێگاگرتن لە ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان لە پێشێلکردنی ماف و ئازادی‌یەکانی کەسان .

کەواتە دەتوانین بڵێین گیروگرفتی سەرەکیمان لە چوارچێوەی ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسی‌ی ئازاددا ، گیروگرفتی دۆزینەوەی هاوسەنگی‌یەکە لە نێوان ئازادی پێویست بۆ ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان و مافی پێویست بۆ تاکەکانی کۆمەڵ و کۆمەڵ بەگشتی .

سەبارەت بە ئازادی ڕۆژنامەو ڕۆژنامە نووسان لە کۆمەڵگەی شارستانیدا دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە ئازادن و هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکیان لەبەردەم دانانرێ مەگەر بەپێی یاسا نەبێت .

بەڵام بۆئەوەی هاوسەنگی دروست بێ لەنێوان ئەو ئازادی‌یەی بەڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان دراوە لەگەڵ ئەو مافەی کەهەرتاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵ و کۆمەڵ بەگشتی هەیەتی دەبێ چوارچێوەیەك بۆ پرۆسەکردنی دیاربکرێ ئەویش بریتی‌یە لە ڕێزگرتن لە مافی کەسان و بەرژەوەندی گشتی و نیزامی گشتی کۆمەڵ .

لەبەرامبەر ئەو ئازادی‌یەی کە دراوەتە ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان هاوولاَتیان و کۆمەڵ بۆیان هەیە لە ڕێگای دادگاوە یان لەڕێگای هەمان ڕۆژنامە یان هەر ڕۆژنامەیەکی ترەوە داکۆکی لە مافی خۆیان بکەن بەرامبەر خراپ بەکارهێنانی ئەو ئازادی‌یە لەلایەن ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسانەوە .

سەرەتا سەبارەت بە ئازادی ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان سێ‌بنچینەی یاساییمان هەیە ئەم ئازادی‌یە بەرجەستەدەکەن، یەکێکیان ماددە/ ٢٦ ی دەستوری عیراقی ساڵی ١٩٧٠ یە کەتیایدا هاتووە : ( دەستور کەفالەتی ڕادەربڕین و بڵاوکردنەوەی دەکات ) . ئەوەی تریان ماددە / ٢ ی یاسای چاپەمەنی هەرێمی کوردستان ژمارە ١٠ ی ساڵی ١٩٩٣ یە کەتیایدا هاتووە : ( لە هەرێم سانسۆر لەسەر چاپەمەنی نیەو هەموو هاوولاَتی‌یەك تیایدا ئازادن لەدەرکردنی هەر چاپەمەنی‌یەك بەپێی حوکمەکانی ئەم یاسایە ) . هەروەها

یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان ژمارە ٤ ی ساڵی ١٩٩٨ سەنەدێکی ترە بۆئەم ئازادی یە .

بەڵام هەروەکو لەپێشتر ئاماژەمان پێی کرد ئەو ئازادی یە ڕەهانیە بەڵکو بەپێی هەندێك بنچینەی یاسایی لە یاسا جیاجیاکانی وڵات دا ڕێکخراوەو ڕۆژنامەنووس و ڕۆژنامەی سەرپێچی کەر ڕووبەڕووی سزا دەکەنەوە ،

یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان لە ماددە / ٢٠ دا کۆمەڵێك ئەرکی خستۆتە ئەستۆی ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان لە هەقیقەتدا ئەم ئەرکانە گشتیان ئەرکی یاسایین و سەرپێچی کردنیان بە بەرپرسیارێتی کەم تەرخەمی ( المسؤلية التقصيرية ) دەداتە پاڵ خاوەنەکەی و ڕووبەڕووی سزای یاسایی دەکاتەوە .

یاسای سزاکانی عیراقی ژمارە ١١١ ی ساڵی ١٩٦٩ ی هەموارکراولە ماددە / ٤٣٣ تا دەگاتە ٤٣٨ ی بۆ تاوانەکانی القذف والسب و افشا و السر تەرخان کردووە و ڕودانی ئەمانەی بە زەرفێکی موشەدەد داناوە ئەگەربێت و لەڕێگای بڵاوکردنەوە لە ڕۆژنامە یان چاپەمەنیەکان یان بەیەکێك لە ڕێگاکانی تری ڕاگەیاندن ئەنجام بدرێ . سزاکەش بریتی یە لە بەندینشین و غەرامە یان یەکێکیان .

هەروەها یاسای چاپەمەنی هەرێمی کوردستان ژمارە ١٠ ی ساڵی ١٩٩٣ ماددە/ ١٠ و ماددە / ٤ ی بۆ بەرپرسیارێتی ی ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان تەرخان کردووەو لە ماددە / ١٠ دا هاتووە : ( خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەرو نووسەری وتار لە بڵاوکردنەوەی خولەکیدا و پێشکەشکەری بڵاوکراوەی ناخولەکی ڕووبەڕووی لێپرسینەوەی یاسایی دەبنەوە بە پێی یاسا کارپێکراوەکان لە حاڵەتی سەرپێچی کردنی ئەحکامەکانی ئەم یاسایە ) .

هەروەها لە ماددە / ٤ داهاتووە : ( خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەرەکەی بەرامبەر بەیاساو بەرامبەر بە دادگا بە هاوکاری لێی بەرپرسیارن ) .

لەکۆتاییدا ، دەتوانین بڵێین سەرەڕی ئەو ئازادی یەی بە ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان دراوە بۆ پرۆسەکردنی کارەکانیان و دروستکردنی ڕای

گشتی ی سەبارەت بە مەسەلە گرینگەکان کەچی ئەم ئازادی یە بێسنوور نیە بەڵکو لێرەو لەوێ بە چەندین بنچینەی یاسایی فەرمانکەر سنووری بۆ داندراوەو

لێلادانیان خاوەنەکەی ڕووبەڕووی سزایەکی یاسایی دەکاتەوە

ئەمەیە ئەو هاوسەنگی یەی ئێمە بەدوایدا دەگەڕاین بۆ پەیداکردنی لەنێوان ئازادی ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان لەلایەك و مافی هاووڵاتیان و کۆمەڵ لەلایەکی ترەوە.

لەدونیادا هیچ ماف و ئازادی یەکی ڕەها نی یە چونکە هەموو مافێك ئەرکێکی بەرامبەرە بەمانایەکی تر دەتوانین بڵێین ماف ڕووی دووەمی ئەرکە واتە ئەگەر ڕۆژنامەنووسان مافی ئازادی ڕۆژنامەنووسیان هەبێ هەڵبەتە ئەرکی ڕێزگرتنیش لە مافی هاووڵاتیان و کۆمەڵیش بەگشتی دەکەوێتە ئەستۆیان.

هەرسەرکەوتووبێ ئەم یادە پیرۆزە

گەشەداربێ ڕۆژی ڕۆژنامەگەری کوردی ...

نەمری بۆ میر مقداد بەدرخان و پیرەمێردو حوزنی موکریانی و گشت شۆرە سوارانی مەیدانی ڕۆژنامەگەری کوردی ..

هەر شەکاوەبێ ئاڵای بەرزی کوردستان .

# قەیرانی ئازادیی ڕۆژنامەگەریو ڕێگاچارەیەک

لەم دواییەدا لە ئاکامی سەرپێچیکردنی هەندێک ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان و حاڵیئەبوونیان لە چەمکی ئازادیی ڕۆژنامەگەریو لێڵیی و تەمومژاوی حوکمەکانی یاسای چاپەمەنی کۆمەڵێک کێشەی ڕۆژنامەگەری بۆ دادگاکانی کوردستان بەرزبۆوە و کار وا بڕوا هی تریشی بەدواوە دێت و قەیرانی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە کوردستاندا دروست دەبێت .

بۆیە بە پێویستم زانی ، لە خوارەوە لە چەند خاڵێکدا بەکورتی هەندێک تێبینیو ڕاوسەرنجی خۆم لەبارەی یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان بخەمە بەرچاوی ئەنجومەنی سەندیکای ڕۆژنامەنوسانی کوردستان و خوێنەران ، لەگەڵ هەندێک پێشنیاری پێویست بۆ چارەسەری ئەم قەیرانە . هیوادارم سوودیان هەبێت :

یەکەم : یاسای چاپەمەنی ژمارە ( ١٠ ) ی ساڵی ١٩٩٣ بەرلە هەمواركردنی و دوای هەمواركردنیشی هەرچەندە هەندێک لایەنی ڕۆژنامەگەری ڕێک خستووە و هەندێک کرداریشی یاساغ کردوە ، کەچی بەلای سزاکانەوە نەچووە .

جا بۆیە بەپێی ئەو بنچینەیەی کە دەڵێ (( لاجریمه ولا عقوبه الا بنص )) یان (( لا اجتهاد في مورد النص )) دەبێ دادوەر بگەڕێتەوە بۆ یاسای سزادانی عێراقیو یاساکانی تری پەیوەندیدار و بەسەر ئەو کێشەیەی کەبۆی بەرز دەکرێتەوە بیان چەسپێنێ .

دووەم : یاسای چاپەمەنی تەنها باسی ئەو چاپکراوە خولەکیانە دەکات کە تاکەکەسی سروشتی ( مرۆڤ ) دەریان دەکات ، بۆیە زاراوەی ((هاووڵاتی)) بەکار هێناوە بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێ چاپکراوێکی خولەکی دەربکات و

بەلای کەسی مەعنەویدا نەچووە ، جا ئەو کەسە حکومەت بێت یان حزب و کۆمەڵەو ڕێکخراوی جەماوەری بێت . ئەمەش خۆی‌لەخۆیدا کەموکورییەکی گەورەیەو دەبێ چارەسەر بکرێ، چونکە ڕێکخستنی هەرجۆرە چاپکراوێك لەو چاپکراوانە ( تاکەکەسی ، حزبی ، حکومی ) لەوەی‌تر جیاوازەو پێویستی بە حوکمی تایبەتی هەیە .

سێیەم : یاسای چاپەمەنی جیاوازیی نەکردووە لە نێوان چاپکراوی خولەکیی سیاسی‌و چاپکراوی خولەکیی ناسیاسیدا . هەروەها یاسای سەندیکاە ڕۆژنامەنوسانی کوردستان جیاوازیی نەکردووە لە نێوان ماف و ئەرکەکانی ئەو ڕۆژنامەنووسانەی کە لە چاپکراوی خولەکیی سیاسی‌و ناسیاسیدا کار دەکەن . ئەمەش خۆی‌لەخۆیدا چەندین گرفتی بۆ سەندیکا دروست کردووەو بۆتە هۆی ئەوەی کە هەرهەموو ئەو کەسانەی کە لەو چاپکراوە خولەکیانەدا کاردەکەن داوای ئەندامێتی‌و گشت مافەکان بکەن کە لە هەمو دنیادا شتی وەها نییە .

چوارەم : دەرکردنی چاپکراوی خولەکی‌و چاپخانەو کتێبخانەو فرۆشیاری گەڕۆك ، چوار چەمکی لەیەك جیانەکراوەن و پەیوەندییەکی بەهێزیان بەیەکەوە هەیە و ناکرێ ئێمە ئازادی بۆ یەکێکیان دەستەبەر بکەین و چاوپۆشیش لەوانەی تر بکەین . بەلأم یاسادانەری کوردستان ئەمەی کردوەو کارەکانی چاپخانەو کتێبخانەو فرۆشیارە گەڕۆکەکانی فرامۆش کردووە . لەو حاڵەتەشدا دەبێ بگەڕێینەوە بۆ یاسای چاپخانەکان و یاسای کتێبخانەکانی عێراقی کە دوو یاسای جیاوازن لە یاسای چاپەمەنیی کوردستان .

پێنجەم : بوونی دەستەواژەی (( سانسۆر ناخرێتە سەر چاپەمەنییەکان)) لە دووتوێ یاسای چاپەمەنیداو نەبوونی هیچ سزایەك تیایدا ، وای لە هەندێك ڕۆژنامەنووس کردووە کە بە هەڵە لە مانای ئازادیی ڕۆژنامەگەری بگەن کە بەشێکە لە ئازادیی هەر کەسێك لە کەسەکانی کۆمەڵ و لێی جیاناکرێتەوە .

ئەو ڕۆژنامەنووسانە ، پێیان وایە یاسای چاپەمەنی بە یاساغ کردنی سانسۆر، ئەوپەڕی ئازادیی داونەتێ ، بۆیە بە ئارەزوی خۆیان و بێ هەستکردن بە لێپرسینەوە دادەبەزنەسەر شەرەف و کەرامەتی خەڵك و پیرۆزەکانی ئەم گەلەو لەکەداری دەکەن . لەکاتێکدا ئازانن کە هیچ ئازادییەك بێ بەرپرسێتی نییەو هەموو ئازادییەك بەرپرسێتی لەگەڵدایە . واتە ڕۆژنامەنوس هەمیشە مەسئولە لەو شتانەی کە دەیان نوسێت و بڵاویان دەکاتەوە . لێرەدا ڕۆژنامەنووس هیچ جیاوازییەکی نیە لەگەڵ تاکەکەسێکی تری کۆمەڵدا ، تەنها ئەوەندە نەبێ کە لە دەربڕینی بیروڕایدا ئازادەو پێویستی بە ڕەزامەندی حکومەت نیە بۆ دەربڕینی بیروڕای خۆی .

هەڵبەتە ئەمەش خاڵێکی گرینگەو مەیزەیەکە دراوە بە ڕۆژنامەنووس تاوەکو بتوانێ وەك چاودێرێك ڕۆڵی خۆی لە چاودێریکردنی کاروبارەکانی حکومەت ببینێ . بێ ئەوەی گوێ بداتێ ئایا حکومەت ڕازییەلەوەی دەینووسێ یانە نا .

بەڵام دیسان لێرەدا ، ڕۆژنامەنووس تەواوی بەرپرسیارێتیی یاسایی دەکەوێتە ئەستۆو نابێ لە نووسینەکانیدا سەرپێچی حوکمەکانی یاسای چاپەمەنیو یاساکانی تری وڵاتەکەی بکات، چونکە ئەویش لەم ڕووەوە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ هاوڵاتیەکیتر نیە .

بۆنمونە ، لە هەموو دنیادا ، ناووناوبانگ زڕاندنی خەڵك و بوختان پێکردن و هاندانی خەڵك بۆ کردنی تاوان و یاخیبوون لە ڕێزگرتنی یاسا ، بەپێی یاسای سزادان تاوانەو ئەو کەسەی بەکارێك لەو کاران هەستێ ڕووبەڕووی سزای یاسایی دەبێتەوە .

جا لێرەدا ، ناکرێ ئێمە ڕۆژنامەنووسان لەم حوکمە ببەینە دەرەوەو خەڵکانی تریش وەکو خۆی بهێڵینەوە .

خۆ ئەگەر وابێت ، ئەوکەسەی بیەوێ بە کارێك لەو کارە تاوانانە هەستێ، وای بۆ باشە رووبکاتە ڕۆژنامەکان تاوەکو لە سزا ڕزگاری بێت ، ئەمەش کەی ڕەوایە .

بەپێچەوانەوە ، ئەنجامدانی یەکێك لەو کردارانەی سەرەوە لە ڕێگای ڕۆژنامەوە بە بارودۆخێکی توند ( ظرف مشدد ) لەقەڵەم دەدرێت و سزاکەشی توندتر دەبێ لە سزای حاڵەتەکەیتر ، چونکە شوێنواری ئەم تاوانانە بۆ ماوەیەکی زۆرتر لە جۆرەکەیتر دەمێنێتەوەو کاریگەرتریش دەبێ بۆیە هەمیشە یاسادانەر بە بارودۆخێکی توند دایدەنێت . ئەمە حەقیقەتێکە ناکرێ ئێمە خۆمانی لێ بێئاگا بکەین .

شەشەم : هەندێك لە ڕۆژنامەنووسان باوەڕیان وایە کە دەبێ هەمیشە سەندیکا لە سەنگەری ئەوان دابێ بۆ داکۆکیکردن لێیان لە حاڵەتی ڕووبەڕوو بوونەوەیان بۆ لێپرسینەوەی یاسایی . ئەمەش باوەڕێکی چەوتەو دەبێ ڕاست بکرێتەوە ، چونکە ڕۆژنامەنووس ئەگەری ڕووبەڕووبوونەوەی سێ جۆرە لێپرسینەوەی لێ دەکرێ ئەگەرهاتوو سەرپێچی یاساو بنەماکانی ئەخلاقی پیشەکەی بکات . ئەمانەش لێپرسینەوەی تاوانکاریو لێپرسینەوەی شارستانیو لێپرسینەوەی پیشەییە ویڕای لێپرسینەوەی ئیداری ئەگەر ئەو ڕۆژنامەنووسە ڕۆژنامەنووسێکی حکومی بوو .

بۆیە ئەگەر هاتوو ، ڕۆژنامەنووس سەرپێچی حوکمێکی یاسایی یان بنەمایەك لە بنەمایەکانی بەڵگەنامەی شەرەفی پیشەکەی کرد ، نەك بەتەنها لەلایەن دادگایان ئیدارەوە بەڵکو لەلایەن خودی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانیشەوە دەبێ سزا بدرێ .

حەوتەم : یاسای چاپەمەنی هەریمی کوردستان بەشێکە لە نیزامی قانوونی عێراقی ، هەرچەندە بنچینەکانی ئەو یاسایە تایبەتن لەچاو بنچینە یاساییەکانی یاساکانیتر لەناو ئەو نیزامە یاساییەدا ، بەلام خۆ ئەگەر حوکمێکمان لەناو یاسای چاپەمەنیدا دەست نەکەوت ، ئەوا بێگومان دەبێ پەنا ببەینە بەر یاساکانی تری پەیوەندیدار لەناو ئەو نیزامە یاساییەدا و بیچەسپێنین .

هەشتەم : سەندیکای ڕۆژنامەنووسان لەوەتی دامەزراوە تاکو ئێستا جگە لە دەستنیشانکردنی هەندێك ئەرك لە دووتوێی یاسایەکەیدا ، نەیتوانیوە

بەڵگەنامەیەکی شەرەفی پیشە بۆ ڕۆژنامەنووسانی خۆی دەرکات تاوەکو پابەندی بن و لە حاڵەتی سەرپێچیکردنیشدا سزای پیشەییان بەسەردا بسەپێنێ ، کە ئەمە یەکێکە لە ئیشە سەرەکییەکانی سەندیکا. بە بڕوای‌من ڕۆژنامەکانی لای ئێمەش تاکو ئێستا بەڵگەنامەیەکی شەرەفیان بۆ ڕۆژنامەنووسانی خۆیان دەرنەکردووە بە پێچەوانەی ڕۆژنامەکانی دنیا .

نۆیەم : پێمان باشە سەندیکای ڕۆژنامەنووسان ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بگرێتەبەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسان لە هەرێمی کوردستاندا :

١ سازدانی سیمینارێك بۆ ئەم مەبەستە بە پشت بەستن بە مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەددین ، ئەوانەی پسپۆڕن لە بواری ماف و ئازادییە گشتییەکان و نیزامە سیاسییەکان و ئازادیی ڕۆژنامەگەری و یاسای تاواندا .

داوا لەو مامۆستا پسپۆڕانە بکرێت ، بە تۆژینەوە بەشداری بکەن لەو سیمینارەدا بۆ دەستنیشانکردنی سنووری ئازادیی ڕۆژنامەگەری و چوارچێوە یاساییەکەی لە هەرێمی کوردستاندا .

هەر بۆ ئەم مەبەستە ، میوانداریی وەزیری ڕۆشنبیری و وەزیری ناوخۆو وەزیری داد و وەزیری مافی مرۆڤ بکرێت و میوانداریش بۆ خەڵکانی‌تر گشتی بێت .

ئەوکاتە دوای خوێندنەوەی هەر تۆژینەوەیەك لەو تۆژینەوانەی پێشکەش دەکرێن ، دەکرێ گفتوگۆ کراوە بێت و وەزیرە بەڕێزەکان و خەڵکیش موناقەشەی تۆژەرەکان بکەن . ئەمەش خۆی‌لەخۆیدا ، دەمانگەیەنێتە ئاکامێکی باش و مەنتقی .

٢ پێکهێنانی لیژنەیەك لەلایەن سەندیکاوە بۆ دیراسەکردنی ئاکامەکانی ئەو سیمینارەو بەرزکردنەوەی ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل لەو بارەیەوە بۆ ئەنجومەنی سەندیکا.

٣ پێکهێنانی لیژنەیەك بەبەشداریبوونی مامۆستایانی زانکۆ، ئەوانەی پسپۆرن لەو بوارەدا کە لە خاڵی پێشوو ئامارەمان پێی کرد ، بۆ دانانی پرۆژەیەکی یاسایی تێروتەسەل بۆ دەسەڵاتی رۆژنامەگەری ، بەچەشنێك کە زۆربەی لایەنەکانی رۆژنامەگەری بگرێتەخۆ ، لەوانە لایەنی رۆژنامە بە هەرسێ جۆریەوە ( رۆژنامەی تاکەکەسی ، و رۆژنامەی حزبی ، و رۆژنامەی حکومی ) ، هەروەها حوکمەکانی رۆژنامەی سیاسیو رۆژنامەی ناسیاسی لەیەکتری جیا بکرێتەوە .

هەروەها لایەنی چاپخانەو کتێبخانەو فرۆشیارە گەرۆکەکان .

هەروەها لایەنی تایبەت بە ئەنجومەنی باڵای رۆژنامەگەری بە هەردوو سەندیکای رۆژنامەو رۆژنامەنووسانەوە .

دواتر لایەنی سزادان و دادبینی سزایی و دادگای تایبەتمەند بە یەکلاکردنەوەی کێشەکانی رۆژنامەگەری .

٤ بڵاوکردنەوەی پرۆژە گەڵاڵەکراوەکە لە رۆژنامەکانی ناوخۆداو بەستنی کۆڕو سمینار بۆ گفتوگۆکردن لەبارەیەوە . ئینجا دووبارە دارشتنەوەی پرۆژەکە لەلایەن لیژنەیەکی تایبەتمەند ، کە سەندیکا بۆ ئەم مەبەستە پێکی دەهێنێ .

دواتر بەنووسراوێك بۆ وەزارەتی رۆشنبیری بەرز بکرێتەوە بۆ هەناردنی بۆ لیژنەی دارشتنی یاسایی لە وەزارەتی داد تاکو ئەویش بە دەوری خۆی بۆ پەرلەمان بەرزی بکاتەوە .

## لەکتێبە چاپکراوەکانی دانەر:

١. شـەش کورتـەچیرۆکی کـوردی   هاوبـەش چاپخانـەی شـارەوانی ١٩٧٦.
٢. ون بوون   چیرۆك چاپخانەی ڕۆشنبیری ١٩٨٤.
٣. دەرکا   چیرۆك چاپخانەی زانکۆ ١٩٩٠.
٤. سەعید زەبۆکی لای خۆمان   ڕۆمان چاپخانەی ڕۆشنبیری ١٩٩٦.
٥. چـەمکی مـاف   چـاپی یەکـەم + چـاپی دووەم چاپخانـەی کریسـتال ١٩٩٨.
٦. لێکدانەوەی یاسای بەکرێدان چاپخانەی زانکۆ ١٩٩١.
٧. چەمکی یاسا چاپخانەی زانکۆ ١٩٩٩.
٨. حقوق المؤلف چاپخانەی کریستال ١٩٩٧.
٩. یاساو ماف چاپخانەی زانکۆ ١٩٩٨.
١٠. مافی دانەر   وەرگێران، هاوبەش چاپخانەی زانکۆ ٢٠٠٠.
١١. ترحێو   چیرۆك چاپخانەی زانکۆ ١٩٩٨.
١٢. دەسەڵاتی چوارەم چاپخانەی ڕۆشنبیری ١٩٩٨.
١٣. هونەری منداڵان چاپخانەی کریستال ١٩٩٨.
١٤. یاسای ڕۆژنامەگەری ، چاپخانەی قەلا ٢٠٠٣.
١٥. ئازادیی ڕۆژنامەگەریو ئەخلاقی پیشە، چاپخانەی منارە، ٢٠٠٤.
١٦. تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری، چاپخانەی منارە ٢٠٠٤.
١٧. ئازادیی ڕۆژنامەگەریو دیموکراسییەت، چاپخانەی کەوێڵ ٢٠٠٤.
١٨. حقوق الانسان ، چاپخانەی پەروەردە، ٢٠٠٤.

## لەبەرهەمە چاپکراوەکانی پرۆژەی ماف:

١- پەیرەوپرۆگرامی رێکخراوی بلاوکردنەوەی رۆشنبیریی یاسایی ٢٠٠١.
٢- الفدرالية الكوردستانية و التوقعات المستقبلية ٢٠٠١.
٣- لەبارەی رۆشنبیریی سیاسی - د. شیرزاد احمد النجار - و. محمد وەسمان ٢٠٠٢.
٤- دەماگیریی نەتەوایەتی - د. محەمەد گەزنەیی ٢٠٠٢.
٥- مساهمة في الامن القومي و سياسة الدفاع و جدلية العلاقة بينهما الحقوقي / ماجد طاهر خليل ٢٠٠٢.
٦- یاسای رۆژنامەگەری - د. کەمال سەعدی ٢٠٠٣.
٧- شرح قانون الجنسية العراقية – المحامي سركوت سليمان.
٨- شرح اصول المحاكمات الجزائية – د. رزگار محمد قادر، ٢٠٠٤.
٩- ئازادیی رۆژنامەگەریو ئەخلاقی پیشە – د. کەمال سەعدی، ٢٠٠٤.
١٠- فەلسەفەی یاسا /پ.د.عبدالرحمن رحيم عبدالله / وەرگێرانی عوبێد خدرو سەرکەوت سلێمان و هیوا ابراهیم حەیدەری /٢٠٠٤
١١- قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية/٢٠٠٤
١٢- پێناسەی دەستوور/ د.عبد الرضا الطعان/ وەرگێرانی سابیر رەشید /٢٠٠٤
١٣- السيادة و التدخل الانساني /د.مهدي جابر مهدي/٢٠٠٤
١٤- ئۆپەرێتی بالاسیمیا/ هۆنراوەی کازم کۆیی/٢٠٠٤
١٥- پەیامی یاسا/ دلێر ئیبراهیم/٢٠٠٤
١٦- النظرية العامة لحقوق الانسان/د. جابر صابر طه /٢٠٠٤
١٧- یاسای (دادگای تاوانکاری عێراقی تایبەتمەند)کریم محمد سۆفی/٢٠٠٤

١٨- ضمانات حماية حقوق الانسان في اقليم كوردستان العراق /يعقوب عزيز قادر/٢٠٠٤

١٩- خولى كۆمپيۆتەر و رۆشنبيرى ياسايى/توانامحمد/٢٠٠٥

٢٠- ياسا ژيانىٚ/هاشم ئەتروشى/٢٠٠٥

٢١- راستى و ياسا /دايكى بەهرە/٢٠٠٥

٢٢- بەرەو ياسا/هاشم حوسێن بلباس /٢٠٠٥

٢٣- الشرائع السماوية السابقة .../د.محمد گزنى/٢٠٠٥

٢٤- ئاوێنەى شارستانى/كازم كۆيى /٢٠٠٥

٢٥- ظاهرة عمل الاطفال في محافظة دهوك/حاجي رمضان بيسكى و شريف تيجر/٢٠٠٥

٢٦- فەلسەفە و ياسا لە چەند وتارێكدا /د.كمال سعدى/٢٠٠٥